ئیمامی غەزالی

# ئەی ڕۆڵەی هۆشیار

## أيها الولد





وەرگێڕ

محسن جوامێر

چاپی یەکەم

# ئەی رۆڵـەی هۆشیار


نوسینی

ئیمامی غەزالی

وەرگێڕ

محسن جوامێر



چاپی یەکەم

١٤٣١ کۆچی ٢٠١٠ زاینی

- ناوی کتێب : ئەی ڕۆڵەی هۆشیار .
- نوسەر : ئیمامی غەزالی .
- وەرگێڕ : محسن جوامێر .
- تایپ و هەڵەچن : بڕوا حمەکریم .
- دیزانی بەرگ : بڕوا حمەکریم .
- چاپ : یەکەم .
- چاپخانە : سیڤا ـ شەقامی مەولەوی .
- ژ. سپاردن : (     ) ٢٠١٠ ی پێدراوە .

# بسم الله الرحمن الرحيم

## غـــــەزالــــی

غەزالی، ئەم دەنگە نەمرەیە، لە ناخی مێژوودا شوێنی ڕەوای خۆی دۆزێتەوە....

چونکو هەمیشە هاوارو بانگەوازی بۆ ئەمە بووە مرۆڤ خوا بناسێ و خۆی نەکا بەهاوڕازو نیازی ئەو هێزەی لە پێڕەوی خوا لای دەبا.

غەزالی، ئەم مرۆڤەیە لە قوتابخانەی قورئانەوە خۆی ناسیوەو لە میحرابی ئەوێدا پەروەردە کراوە و شاگردێکی هەرە بەئەمەکی محمدە (د.خ) لێ بێ..

غەزالی، ئەم هێزە ئیسلامخوازەیە لە دژی ئەوان کەسانە دەوەستا، کەلەژێر ناوی جیاجیا زنجیرەی باوەڕیان لێک دەپساندو گوێ لە مستی فەلسەفەکانی بێگانە دەبوون.

غەزالی، دەستەمۆی ڕاستەقینە بوو.....

بەدوایا عەودالْ و هەراسان بوو.... بۆیە ئارامی لەخۆیدا دەبڕی...گڕی کەوتبووە خوێنی....بەلاّم لە دیماهیدا لەباوەشی قورئاندا ئۆخەی کردو دۆزیەوە...بۆیە تادوا هەناسەی لە ئامێزی قورئاندا بە ئەسپایی کۆششی کرد...دەستەبەری ژیانێکی

خۆشی کرد بۆ هەریەکێک دڵی خۆی لە مست خوا بنێت و لەگەڵ خوادا بژی.
غەزالی، ئیسلامخوازێکی ئازازو زیخ بوو، دلێر بوو، هەمیشە خەڵکی هان دەدا بۆئەوەی خۆیان نەهاوێنە سەر سفرەو خوانی ئەمیرەکان، هەتا چەهرەشیان نەبینن، چونکینێکە نەخواناسن و نەدەستەمۆی بیرو باوەڕی خوایین.
لەلهەق شانازیش هەر بۆ ئەم ئیسلامە خێن شیرینەی خۆمانە، کە هەزارەهای وەکو غەزالی ی هانیوەتە کایەوەو...هەزارەهای لە غەزالیش غەزالی تر دێنێتە کایەوە.
بۆیە باکوردی و بە کورتی، کەمێک لە غەزلی بدوێین...غەزالی شاگرد.
تانەختێ بەمەوە دڵمان ئاوێ دەخواتەوەو غەزالی فەیلەسوف و پیتۆڵیش لە سوچێکی دڵماندا دەگیرسێتەوە...

## ژیان و کردەوە نەمرەکەی غـــــــەزالی

ناوی محمدی کوڕی محمدی کوڕی ئەحمەدی توسیە. ناوبانگی بە ئەبوحامیدی غەزالی دەرکردووە. لەساڵی (٤٥٠)ی کۆچیدا واتا لە (١٠٥٨)ی زایینیدا لە (تابران) کەسەر بە ناحیەی تووسی (مەشهەد)ە لەدایک بوەو، لەساڵی (٥٠٥)ی کۆچیدا واتا لە (١١١١)ی زایینیدا کۆچی دوایی کرد.

بەرلەوەی باوکی کۆچی دوای بکا، هەستا غەزالی و براکەی بە دۆستێکی سۆفی و خێرخوازی سپارد، ئەمەش بۆئەوەی لەدوای مردنیدا منالەکانی بێ سەرو شوێن نەمێننەوە... بۆیە هەر کەباوکی ئەمری خوای کرد، کابرا بردیانیە لای خۆی و جلەوی پەروەردەکردنی ئەم دوو کوڕەی خستە بەردەستی خۆی، ئەمەش تا ئەو ڕۆژەی ئەم ماڵە دراوەی باوکی لای کابرایە بۆی بەجێ هێشتبوون چکی کردو بنی هات، ئەنجا توانی ئەوەی نەما بەخێویان بکا..بۆیە نسحەتی کردن تا بچنە قوتابخانەو لەوێندەر بەو قووتەی پێیان دەدرێ دەتوانن بشخوێنن و خۆشیان بەڕێوە بەرن.

غەزالیش هەرلەسەرەتای ژیانیەوە، کەڵکەڵەی زانستی و زانیاری خۆی ئاخنی بووە نێو دڵ و مێشکیەوە... بۆیە لەماڵیەوەو لە مەڵبەندی یەکەمی خۆیدا و لەسەر دەستی عەلی ئەحمەدی ڕازیکانی دەستی کرد بە خوێندنی بەشێکی(فقه)، ئەنجا چوەتە جرجان لەوێندەر لەسەر دەستی ئیمام ئەبی نەسری ئیسماعیلی ئەنجا خوێندویەتی. لەپاشدا گەڕاوەتەوە توس ئەنجا هەستی بەمە کرد کەشاری نیسابوور (پایتەختی سەلجوقیەکان)، مەڵبەندی زانستی و زانیاریە و بەدووەم شار لەدوای شاری بەغدا دێ.. بۆیەش بەفڕکان ڕووی کردە ئەوێ و لەوێش بوو بە قوتابی ئیمامی حەرەمەین* و ڕۆژ لەدوای ڕۆژدا لەمەزهەب و خیلاف و جەدەل و (اصول)، گەشەی بەزانستی خۆی دەسەند.

---

* ئەبو مەعالی، عەبدوڵەلیکی کوڕی یوسفی جوینیە، لەگەڵە زاناکانی ڕێبازی شافیعیە...لەبەر زانایی و لێهاتوویی، (نظام الملك) قوتابخانەی (النظامیة)ی لەشاری نیسابوور بنیات نا.

هەرکە ئیمامی حەرەمەین کۆچی دوای کرد، لەساڵی (٤٧٨)ی کۆچیدا غەزالی کردە (معسکر) و لەوێوە چوو بۆ لای (نظام الملك)دا گفتوگۆو دەتەقەی لەبەردەم (نظام الملك)دا لەگەڵ زاناو داناو ئیمامەکانی ئەو سەردەمە دەکرا، غەزالی بەم زانیاریە و بیرتیژیەی هەیبوو ئەستێرەی بەجارێ گەشایەوە..لەبەر هەندێکە لە قوتابخانەی (النظامیة)ی بەغدا بە مامۆستا هەڵبژێردرا. (النظامیة)ش قوتابخانەیەک بوو زۆربەی زانایانی ئەو سەردەمی چاویان تێ بڕیبوو تاوەکو لێ ی ببنە مامۆستا.

ئەو کاتیش جیگەی سەرسوڕمان بوو یەکێکی وەکو غەزالی کەتەمەنی لە (٣٤)ساڵ ڕەت نەبووبێ و لەوێندەر وانەی تیا بڵێتەوە.

فەقەت (فقط) کارامەیی غەزالی خۆی فەرز کردبوو و ناوبانگی گشت دەوڵەتی گرتبووەوە..لەم ماوەیەشدا دوو دڵی و گومان یاخەی لە یاخەی غەزالی نەدەکردەوەو لە زۆر بابەتاندا (مسائل) خۆی ئاخنیە نێو دەروونی غەزالیەوە.

بۆیه ملی نایه بەر موتالاکردنی کتێبه فەلسەفیەکانی فەلرابی و ئیبن سینا، لەپاش ئەمەشەوه دەستی کرد بە دانانی کتێبی (مقاصد الفلاسفة) کەتیایدا باسی چەند مەسەلەیەکی فەلسەفی دەکات، بێ ئەوەی نەشتەری ڕەخنەیی تیایدا بەکاربێنێ..بەلام لە کتێبی داهاتوویدا کە (تهافت الفلاسفة) بوو، زەبری ڕەخنەگرتنی وەشاند...لەم قۆناغەی ژیانیشیدا بەجارێ هەوەسی لە سەر وانە گوتنەوە چوو...بۆیە هەستا ئەم وەزیفەی بەجێ هێشت ئەوجە ڕۆژ لەدوای ڕۆژ گومانی لە بیروباوەڕی ئەو سەردەمیدا پەیدا کردو هەمیشە کەوتبووە بیرکردنەوە.ماوەیەک بەم جۆرەو بەم بارە دەروونیەوە مایەوەو خۆشی دوورە پەرێز کردو کەوتە خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەی تاقەکەسی..بەلام بەم بارە دەروونیەی خۆی ئاوی نەخواردەوەو هەستا بۆ ئەم شارو ئەو شار بەڕێ کەوت و بۆماوەی (٥ه) ساڵ گەڕاو گەشتی کرد.لە بەغداوە بۆ شام*و،

---

*لەم وڵاتەدا کتێبی (أحیاء علوم الدین) نووسیەوە.

لەشامەوە بۆ (بيت المقدس) و لە (بيت المقدس)ەوە بۆ مەکە و مەدینە، ئەنجا گەڕاوەتەوە مەفتەنی خۆی و، بۆ ماوەیەک لە (المدرسة النظامية)ی نیسابووردا وانەی گوتوتەوە. لەدوای ماوەیەکدا گەڕاوەتەوە (تووس) و لە نزیک ماڵەکەیدا
قوتابخانەیەکی بۆ فەقێیەکان داناو، خانەقایەکیش بۆ سۆفیاتی دروست کرد.کاتی خۆیشی لەنێوان خواپەرەستی و وانە گوتنەوەو دانیشتن لەگەڵ سۆفیەکاندا دابەش کرد..هەر لە (تووس)یشدا گیانی خۆی بە خوای گەورە سپارد.
لەبەر ئەو بارە شڵۆق و لەبەریەک پساوەی کە دووچاری بیرو باوەڕی خەڵکی بوو، کەئەمەش بەهۆی ڕێگادانی هەندێ لە ئەمیرەکانی موسڵمانان بۆ بڵاوبونەوەی فەلسەفەکانی ڕۆمان و یۆنان و فارسەکان، پەیدا بوو.. ئەو فەلسەفانەی لەسەرچاوەی مسقۆفی*

*لەدەشتی هەولێردا ووشەی (مسقۆف) بۆ ئەوان کەسانە بەکاردێ کە نینتقاتیان بەخوا نیە..بۆیە منیش بە پەسەندی دەزانم (مسوف) بۆ (ملحد) و (مسقۆفی)ش بۆ (الحاد) بەکاربێ.

(**الحاد**) و خەرافیاتەوە ئاویان نۆش کردبووا! (**ببورە قوزەلقورت کردبوو**)...

هەرلەبەر ئەمەشەوە هەندێ لە موسڵمانان لەم ڕێچکەو ڕێبازە بەرزەی بۆیان دانرا بوو، لایان داو کەوتنە شوێن لێکۆڵینەوەو خوێندنەوەی ئەم جۆرە فەلسەفانە و بوون بە پسپۆڕێکی ئەم مەیدانەو لە دیماهیشدا لادانێکی فیکری لەلایەن موسڵمانانەوە پەیدا بوو.

هەڵبەتە خوای خۆشەویستیش لە هیچ چەرخ و زەمانێکا موسڵمانان بێ بەش ناکا لە یەکێکی ئیسلامویستی بلیمەت کەلە ئیسلام بگاو هەوڵی ژیاندنەوەی بدا...هەر بۆیەش غەزالی پێ ڕاگەیاند.. ئەمیش خوا هەڵناگرێ دەورێکی بالاّ نمای بینی لە پێناو لابردنی ئەم تەمومژەی باڵی بەسەر مێشک و بیری موسڵمانان دا گرتبوو، هەروەها لەپێناوی زیندوو کردنەوەو نوێکردنەوەی ئەم ئاینە مەزنە.

لێرەدا با خامە هەرە ڕەنگینەکەی سەرۆکی کۆمەڵی موسڵمانانی پاکستان، مامۆستا ئەعلای مەودوودی،

بە کوردی بخەینە گەڕ، تا کەمێک لەو کارە نوێیەکەی ئیمانی غەزالی بگەین.

مامۆستا مەودوودی لە کتێبی (**موجز تأريخ تجديد الدين و احيائە، وواقع المسلمين وسبيل النهوض بهم**)دا کارە نوێکردنەوەکەی ئیمامی غەزالی دەکاتە هەشت بەش:

١- لە فەلسەفەی یۆنانی کۆڵیەوە، پاشان ڕەخنەیەکی تەواوی لێ گرت، ئەمەش بە شێوەیەک کەسام و هەیبەتی لەلایەن موسڵمانانەوە کەمکردەوەو لەسەر بنچینەیەکی زانستی جەوهەری ئەم فەلسەفەی پێشانی خەڵکی دا...ئەم کارەی ئەمیش هەتا لە وڵاتە ئەورووپاییەکانیشەوە دەنگی دایەوەو دەروازەی دەورێکی نویان بۆ کرایەوە کە ئەمیش دەوری ڕەخنەی زانستی ی ڕاستەقینە بوو.

٢- ئەو هەڵانەی ڕاست کردەوە کە لە لایەن دڵسۆزانی ئیسلامەوە ڕووی دا، ئەوانەی بەتەواوەتی ی ئاگایان لە زانستی عەقڵی نەبوو لەگەڵ ئەمەشدا خۆیان تێهەڵدەقولاند، بەمەشەوە زیانێکی گەورەیان لە ئیسلام دەگەیاند.

٣- بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە بیر و باوەڕی ئیسلام و بنچینەکانی دواوە، بەجۆرێک ڕێگەی لەوان کەسانە گرت کە جڵەوی زانستی ی ئەقڵیان گرتبوو. جا هەستا حیکمەت و پەندی شەرع و خواپەرستی و دروشمەکانی ئیسلامی بۆ ڕوون کردنەوە، بەمەشەوە دەورێکی چاکی گێڕا بۆ ڕیشەکێشکردنی لێکدانەوەی پڕوپووچ.

٤- لەبارەی هەموو دەستەو چینێکی موسڵمانانی کۆڵیەوە کەلەو سەردەمیدا باو بوو. ئەوجە سنوری بۆ کوفرو ئیسلام کێشاو ئەم سنوورەی وەدیار خست کەدەشێ مرۆڤ تیایدا ڕاو (**تەئویل**)ی خۆی دەربڕێ. هەروەها ئەو سنورەشی وەدیار خست کەڕاو و (**تەئویلی**)ی تیا دەرنابڕێ و هەر هەوڵێکی بۆ ئەم مکەبەستە بدرێ هەوڵە بۆ کوفر...بەمەوە خەڵکی لەم جۆرە چینە لەڕێ لادەرانە هۆشیار کردەوەو (**ڕەصید**)ێکی وای بۆ ئەم چینانە نەهێشتەوە.

١٥- شیوەی بیرکردنەوەی خەڵکی بۆ ئاین نوێکردەوە، زۆر دژی ئەوە بوو مرۆڤ بە کوێرایی و بێ هەستو نەست و لێکدانەوە بڕوا بێنێ.

هێرشی بردە سەر لاسایکردنەوەی هیچ و بێ ماناو، هەوڵی ئەوەی دا گیانی (**إجتهاد**) بژیێنێتەوەو کەموکورتی هەر چینێک و بەرەیەکی وەدەرخست و داوای لێکردن گشتیان بگەڕێنەوە سەر ڕێگا ڕاستەکەی ئیسلام.

٦- ڕەخنەی لە ڕژێمی فێرکردنی ئەو سەردەمی گرت و ڕژێمێکی تازە بابەتی هێنایە کایەوەو، نەیهێشت ئەم دیوارەی لە نێوان زانستی ی ئایین و دونیا دانرا بوو، بمێنێ...هەروەها زانستی شەرعی خستە نێو ڕژێمی فێرکردنەوە، کەئەمەش دەورێکی بالأی دیت لەلابردنی زۆر هەڵەو چەوتی..هەڵبەت کاری ئەم ڕژێمەش تا ئێستا هەر ماوە.

٧- لە ڕەوشتی هەموو چینێکی رەمەکی ی کۆڵیەوەو، لاپەڕەی ژیانی زۆر لە زاناو شێخ و ئەمیرەکانی خوێندەوەو بەگەڕانو گەڕۆکیەوە توانی ئاگای لە ژیانی جیهانی ڕۆژهەلأتدا بێ و ڕەخنە لە ڕەوشتی هەر چینێکی ئەم ناوچەیە بگرێ و لە سەرچاوەی هەر خراپیەکی کۆڵیەوەو هەوڵی دا بۆ پیشاندانی پێودانگەی ئیسلام بۆ خوو ڕەوشت.

٨- ئازایانه رەخنەی له ڕژێمی حوکمی ئەو سەردەمە گرتو هەمیشه بانگ و هاواری بۆ چارەکردن و گەڕانەوە بۆ ئیسلام بوو. گیانی زات و دلێری ی لەناو میللەتدا دژی ئەمیرو مەلیکەکان خولقاند...بە ئاشکرا سەرچاوەی ئەو ماڵ و سامانەی وەدەر خست کە مەلیکەکان هەیانبوو، بەوپەڕی ئازاییەوە لە کتێبی (أحياء علوم الدين)دا دەڵێ هەموو ماڵێکی مەلیکەکانی ئەم سەردەمە حەرامە. لەشوێنێکی تریشدا دەفەرموێ (پیاو نابێ ڕووی خۆی نیشانی ئەم مەلیکانه بدا، یا ڕوویان ببینێ، بەڵکو پێویستە هەڵوێستە خراپەکانیان ببوغزێنێ و حەزیش نەکا بمێنن و ، هیچ هەقیشیان بەسەریاندا نەبێ و، هەتا خۆیشی لەوان کەسانە وەدوور بێخێ، کەهەردەم خەریکی ئەوەن لەبەردەم مەلیکەکاندا بن...هەرلەبەر ئەمەش بۆ یەک لەوەزیرەکانی نووسی و پێی گوت: (زوڵم لە سنوری خۆیدا دەرچوو لەبەرئەوەی منیش بە هەردوو چاوی خۆم ئەم زوڵمە دەبینم، بۆیە وا ساڵێکە (تووس)م بە جێ هێشتووە هەتا لە جووڵەو بزوتنەوەی زاڵمەبێ حەیاکان دەربازم بێ).

لەکۆتایشدا مامۆستا چەند سەرنجێکی دەربارەی کارە نوێکاریەکەی ئیمامی غەزالی هەیە کەوای کردووە ئیمامی غەزالی دووچاری چەند کەموکورتیەک بێ ..ئەم دووچار بوونەشی دەگەڕێنێتەوە بۆ سێ هۆ:

یەکەم: غەزالی لە زانستی فەرمایشدا لاواز بووە.

دووەم: زانستی عەقڵی بەسەر زەینیدا زاڵ بووە.

سێیەم: مەیلێکی لەڕاددە بەدەری بۆ (**تصوف**) هەبووە.

(**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار**)*یش، وەرگێڕاوی نامیلکەیەکی ئیمامی غەزالی یە کەلەژێر ناوی (**أيها الولد**)ەوە نووسراوەتەوە، منیش بەو پەڕی شانازییەوە پێشکەش بە خوێنەرانی کوردستانەکەمی دەکەم.

---

*لەم وەرگێڕانە بەولاوە نەدەخێوابێ وەرگێرانێکی دەقی ی بۆ بکەم، کەبە (صیغەی مخاطب) بێ...بۆیە ووشەی (هۆشیار)م خستە سەر (ئەی ڕۆڵە)... بۆنەوەی ئارادەیەك پڕبە (صیغة)کەوە بێ..

پێشەکیش دان بەوەدا دەنێنم کەدوور نیە لەبارەی واتاو دارشتن و زمانەوانیەوە کەموکورتی تیدابێ..چونکی وەرگێڕانی نووسراوەیەکی غەزالی هێندە سانا نیە پیاو نووسراوەکەی بخاتە بەردەمی و بیکاتە کوردی، نەخێر گەرەکە وەرگێڕ خۆی بئاخێنێتە ناو دەروون و جەرگەی نوسینەکانی غەزالی و بەرگی بیری ئەو لەبەر بکا تا ئەو کاتەی دیماهی بە کۆششەکەی دێنێ هەروەها دەبێ لێکۆڵینەوەیەکی درێژی بیروباوەڕو کۆشش و فەلسەفەو هێرشەکانی غەزالی بکا تا تێ ی بگاو دەرکی پێ بکا...ئەنجا لەدوای ئەم سوار سوارانێیە دەست بداتە خامەکەی و بێ دڵە ڕاوکێ دەست بە وەرگێڕان بکا....

منیش نەتەمەنم دەرفەتی ئەوەی داوم ببمە جوامێری ئەم مەیدانەوە، نە پلەی زانیاریشم لەو ڕادەیە بتوانم زۆر بەتەواوەتی و پوختەیی نووسراوەیەکی غەزالی بە کوردی پێشکەش بکەم*.

---

*ئەم قسەیەم لە سالّی ۱۹۷۲ بوو..بەلاّم بەم دواییە جارێکی دیکە پێیداچوومەوە گۆڕان و دەستکاریەکی باشم تێدا کرد.

جا هیوادارم ئەم وەرگێڕانە من ببێتە شەقاوێک بۆ وەرگێڕانی بەرهەمە کۆنە گەوهەردارەکانی ئیسلام کە هەتا دونیا دونیابێ، نرخ و پایەی خۆی هەردەبێ...ئەمەش لە پێناوی ئەوەی نەوەی نوێ ی کورد لەم چەشنە بەرهەمانەی کەگشت زانیاری و زانستەکانیان لە کانیاوی قورئان هەڵێنجاوە، بێبەش نەکەین...

بەخواشتان دەسپێرم...
محسن جوامێر
هەولێر /٢٨-٧-١٩٧٢

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

ئەی ڕۆڵەی خۆشەویست و ئازیز: پێشەکی داوا لە خوا دەکەم تەمەنت درێژ بێ و ببی بە هاوڕێبازی ئەوانەی خوا خۆشی دەوێن....ئەوەش بزانە هەر نسحەتێکی لە منی دەبیستی سەرچاوەکەی پێغەمبەری مەزنە (د.خ) ...جا کە نسحەتی ئەوت بیستبێ، حەوجەی نسحەتی من نی. مادەم وایە دەپێم بڵێ بزانم: ئەمە چەند ساڵ و عەیامە چۆنت ڕابواردووە؟

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** یەک لەم نسحەت و ئامۆژگاریانەی پێغەمبەری مەزن کە بە ئێمەی ڕاگەیاندووە ئەمەیە: **(علامة اللة تعالى عن العبد لا يعنه ، وان امرؤ ذهبت ساعة من عمره فى غير ما خلق له من العبادة لجدير أن تطول عليها حسرته ومن جاوز للاربعين ولم يغلب خيره على شره فليتجهز الى النار اشتغالة بما)** واتا: نیشانەی وازهێنانی خوا لە بەندەی خۆی ئەوەیە: یەکێک خۆی لە کارێک هەڵبقورتێنێ کە هیچ پەیوەندی لەگەڵ ئەودا نەبێ و سوودی پێ نەبەخشێ و ئەگەر مرۆڤێک سەعاتێک لە کیسە خۆی بدا بێ ئەوەی بۆ خوای تەرخان بکا، ئائەو

کەسە شایانی ئەوەیە خەفەت و ئاخ هەڵکێشێ.
ئەگەر یەکێکیش تەمەنی لە چل ساڵ ڕەت بوو و چاکەی لە خراپەی زیاتر نەبوو، بائەو کەسە خۆی بۆ ئاگری دۆزەخ ئامادە بکا...
هەڵبەتە ئەم ئامۆژگاریەش بەسە بۆ ئەوان کەسانەی کە تێدەگەن و فام دەکەن.
**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** ئامۆژگاری کردن ئاسانە، بەڵام پیاوی دەوێ وەریبگرێ و جێ بەجێی بکا، چونکو ئەوەی شوێن پێی ئارەزووی خۆی کەوتووە، ئامۆژگاری ی لە قالب گرانەو ئەمەی خوا پێی ناخۆش بێ ئەوی بەلاوە خۆشە، بەتایبەتی لای ئەو کەسەی هەر خۆی ڕەپێش دەکا و بەهانەی وەزیفە و پایەی دونیایەو واش دەزانێ زانستەکی ڕووت بەسە بۆئەوەی خوا قوتاری بکا...بۆیەوا دەزانێ مەرج نیە پیاو کردەوەی چاک بێ. ئەمەش بیروباوەڕی فەیلەسوفەکانە، بەڵام داخی بەجەرگم ئەم لە خۆ بایی بووە نازانێ ئەگەر هاتوو کار بەم زانستی و زانیاریەی نەکا، ئەو کاتە خوا پتر لێی دەگرێ پتریش خوا لێی دەپرسێتەوە...هەروەک پێغەمبەر دەفەرموێ: (**أشد الناس عذابا يوم القيامة عالم لم**

**ينفعه الله بعلمه )** واتا: بەئەزیەترین کەس لە ڕۆژی قیامەتدا، ئەو زانایەیە کە خەڵکی سوود لە زانینەکەی وەرناگرن.

دەگێڕنەوە، گوایا دوای ئەوەی شێخ جونەیدی بەغدایی خوا لێی خۆش بێ ئەمری خوای کرد یەکێک لە خەودا دیتی و پێ ی گوت: ئەی (**أبا قاسم**) چیت دیت و چیت بەسەر هات؟ ئەویش فەرمووی : (**مەگەر ئەو نوێژانە نەبن کەلە دوای نیوەشەودا کردبوومان*** ، **دەنا سەرجەمی ئەو ووشانەی نووسیبوومان لەناو چوون و هەپڕوون بە هەپڕوون بوون و سوودێکیان بە ئێمە نەگەیاند**).

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** خۆت لە کردەوەی پاک بێ بەش مەکە، ئاگات لە خوا بێ، ئەمەش بزانە زانستی بێ کردەوەی چاک هیچ سوودێک نابەخشێ و پیاویش بە تەنیا بە زانستیەوە دەرباز نابێ... پیاوی زانای بێ کردەوە بە یەکێ دەچێ لە چۆڵێکدا بێ،

---

*واتە شەو نوێژ.

ئازاو شەڕکەرو شمشێر وەشێن بێ، دە شمشێری هیندی و چەند چەک و تفاقێکی تری لە لابێ...هەر دیتت لە هیکرا شێرێکی توونددو تۆلی تووش هات. بەمەزەندەی تۆ کابرا چی دەکا ئایا ئەگەر ئەم شیرو چەک و تفاقە بەکار نەهێنێ سەردەکەوێ و ڕزگاری دەبێ. هەڵبەتە بەکارهێنانی ئەمانەش پێویستی بە دەست وەشاندن هەیە، تابەرگری لە خۆی بکا و خۆی لە مەترسی و زەبرو زەنگی شێری مرۆڤ شکێن ڕزگار بکا.

هەر بەم جۆرەش، ئەگەر یەکێک هەزارەها بابەتی زانستی بخوێنێتەوە و کار بە چتاقیان نەکا، سوور بزانە ئەو زانستیە سوودی بۆ ئەو نیە و شتێکی وای پێ نابەخشێ...ئەمەش لەوە دەکا یەکێک پلەی گەرمای بەرز بووبێ و کەم خوێن بێ و چارەی تەنیا بە دەرمانی سەکنجەبین و کەشکاب* بێ،

*ئەم دوو دەرمانە لە کاتی خۆیدا بەکاردەهێنران، بەڵام نازانم لە کوردستاندا هەنەو بە چیش ناو دەبرێن.

بەلأم چتاقیان بەکار نەهێنێ، هەڵبەتە ئەو کاتە ئەم نەخۆشە چاک نابێتەوە.

هەتاکو جامێ لـــــــەمەی نەنۆشی
قەت سەرخۆش نابی و ئەقڵت نافرۆشی

ئەی ڕۆڵەی هۆشیار: ئەگەر سەد ساڵ بخوێنی و هەزاران کتێب بخوێنینەوە، هەتا کاریان پێ نەکەی، ناکەویە بەر بەخشندەیی و میهرەبانی خوای مەزن. (**وأن لیس للانسان الا ماسعی**) واتا: ئادەمیزاد تا کۆشش نەکا ناگا بە ئاواتی خۆی...(**فمن کان یرجوا لقاء ربه فلیعمل عملا صالحا**) واتا: ئەوەی دەیەوێ بە دیتنی خوا بەختیار بێ و بەهەشتی بێ، با ئیشی چاک بێ...(**جزاء بما کانوا یکسبون**) واتا: ئەمەش پاداشتی ئەو کردەوە چاکانەیەکە دەیکەن...(**ان الذین آمنوا وعملوا الصالحات کانت لهم جنات الفردوس نزلا خالدین فیها لا یبغون عنها حولا**) واتا: ئەوانەی باوەڕیان بە خوا هێناوەو کردەوەی چاکیان کردووە، بەهەشتەکانی فیردەوس شوێنیانەو هەتا هەتایێ مێوانی ئەوێنەو، هەرگیز نایانەوێ بچنە

شوینێکی ترەوە..( **فخلف من بعدهم خلف أضاعوا الصلاة واتبعوا الشهوات فسوف يلقون غيا الا من تاب وعمل صالحا فاولئك يدخلون الجنة ولا يظلمون شيئا** )
واتا: لەدوای پێغەمبەرەکان چینێک هاتن بەتەواوەتی پشتیان لە نوێژ کردو بە جارێ وازیان لێ هێنا بوو، بەدوای شەهوەت و ئارەزووی خۆیاندا عەودالٚ بوون، هەلبەتا ئەمانەش بەفەتارەت دەچن و تووشی نەهامەتی دێن، تەنیا ئەوان کەسانە نەبن کە بەشیمان بوونەتەوەو باوەڕیان بە خوا هێناوەو ئیشی چاک دەکەن، ئەوانەش دەچنە بەهەشت و هەرگیز زولمیان لێ ناکرێ.
ئەی چی بەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (د.خ) دەلێ ی کە دەفەرموێ ( **بني لاسلام على خمس شهادة أن لا اله الا الله وأن محمدا رسول الله، واقام الصلاة، وايتاء الزكاة، وصوم رمضان، وحج البيت لمن استطاع اليه سبيلا** ) واتا: ئیسلام لەسەر پێنج کۆلەکە بنیات نراوە: شایەتمانی بەوەی کە تاکە خوایەک هەیەو محمدیش پێغەمبەری خوایەو، نوێژکردن و، ڕۆژووگرتن و، حەج کردنی ئەو کەسەی لە توانای دایە...

باوەڕکردن بە خواش (**الايمان بالله**) دەبێ بەزار بگوترێ و بە دڵیش تەستیق بکرێ و کار بە فەرمانەکانی بکرێ...بە جێگەیاندنی فەرمانەکانی ئیسلامیش نایەنە ژماردن، چوونە بەهەشتیش لەدوای مل کەچی و خواپەرستیەوە دێتەدی، چونکە بەخشندەیی ی خوا وەبەر ئەو کەسانە دەکەوێ کە ئیشی چاک دەکەن (**رحمة الله قريب من المحسين**).

ئەگەر گوتراش بەندە هەر ئیتقانی بەخوا هەبێ و دەچێتە بەهەشت، ئێمە لەم تافەدا دەبێژین : بەڵێ، بەلاّم کەی دەگاتە پلەی باوەڕ کردن بە خوا؟ دەبێ چەند قۆناغێک ببڕێ هەتا دەگاتە پلەی باوەڕ کردن بە خوا؟ دەبێ چەند قۆناغێک ببڕێ هەتا دەگاتە ئەم پلەیە؟ هەڵبەتە یەکەم قۆناغ ئیتقات و باوەڕهێنانە بە خوا، ئەویش ئایا پیاو دڵنیایە لەوەی لەسەرە مەرگدا بەم باوەڕ و ئیتقاتەوە بمرێ یا نە ء؟ ئەگەریش گەیشتە پلەی باوەڕ هێنان بە خوا، ئایا ئەوسا بە پەشیمانی و دەست بەتاڵی دەگەڕێتەوە؟

حەسەنی بەسری خوای لێ ی خۆش بێ دەفەرموێ (**خوای مەزن لە ڕۆژی قیامەتدا دەفەرموێتە بەندەکانی خۆی (ئەی بەندە ئازیزەکانی من لەبەر**

**سایەو میهرەبانی من بۆ بەهەشت برۆن و هەر یەکێکتان بە پێ ی کردەوە چاکەکانی بەش و نسیبی خۆی وەرگرێ)).**

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار: ئەگەر کار نەکەیت کری وەرناگری.**

دەگێڕنەوە، گوایا کابرایەک لە نەوەی ئیسرائیلیەکان حەفتا ساڵی ڕەبەق خوای پەرست خواش فریشتەیەکی بۆ ڕەوانە کرد تا پێ ی بڵێ لەگەڵ ئەم خوا پەرستیەشی شایانی چوونە بەهەشت نیە. هەر کە فریشتەکەش ئەم قسەیەی پێ ڕاگەیاند، کابرا پێ ی گوت: ئێمە بۆ ئەوە دروستکراوین خوا بپەرستین، بۆیە گەرەکە لەم ڕێگەیەدا کوڵ نەدەین و هەر بیپەرستین. هەر کە فریشتەکە گەڕایەوە فەرمووی: خوایە خۆت دەزانی کابراکە چی گوت، خوای مەزنیش فەرمووی: (**ئەگەر ئەو واز لە ئێمە نەهێنێ، هەڵبەتە ئێمەش بەم ڕەندی و چاکیەی خۆمان واز لە ئەو ناهێنین، ئێوەش ئەی فریشتەکانی من شاهێد بن کە من لێ ی خۆش بووم**).

پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ (**حاسبوا أنفسكم قبل أن تحاسبوا وزنوا أعمالكم قبل أن توزنوا**) واتا: ئێوە

حسێب لەگەڵ خۆتاندا بکەن بەر لەوەی حسێبتان لەگەڵدا بکرێ و کردەوەکانی خۆتان هەڵبسەنگێنن بەر لەوەی هەڵبسەنگێنرێن.
حەزرەتی (عەلی)یش (ر.خ) دەفەرموێ: ئەوەی وا بزانێ بەبێ خەبات بە ئاوات دەگات، ئەو کەسە بە ئاواتەخواز (متمنی) لە قەڵەم دەدرێ. ئەوەی واش بزانێ بە خەبات بە ئاوات دەگات، ئەو کەسە بە (مستغن)ی لە قەڵەم دەدرێ.
شێخ حەسەنی بەسری دەفەرموێ: گوناهە ئەو کەسەی بێ هەوڵو کۆشش داوای بەهەشت بکا، هەروەها فەرموویەتی: نیشانەی ڕاستی و دروستی ئەوەیە مرۆڤ واز لە هەوڵو کۆشش نەهێنێ و هەرگیزیش چاوەڕێ ی پاداشتی ئەو چاکەیەی کردوویەتی نەکا. پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: (**الكيس من دان نفسه وعمل لما بعد الموت، والاحمق من اتبع هواه وتمنى على الله تعالى الاماني**) واتا: پیاوی دانا ئەو کەسەیە کە حسێب لەگەڵ خۆیدا دەکا و هەوڵ بۆ دوای مردن دەداو کردەوەی چاک دەکا، گەوجیش ئەو کەسەیە بەدوای هەواو ئارەزووی خۆی

دەکەویٚ و هیوا خوازیشە کە خوا لیٚ ی خۆش بیٚ و ڕەحمیٚکی پیٚ بکا.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** چەندەها شەو نەدەنووستی و خەوت لە خۆ حەرام دەکردو کۆششت بۆ زانستی دەکردو کتیٚبت دەخویٚندەوە، نازانم هۆی ئەمە چی بوو؟

ئەگەر هەر بۆ ئەوە بووبیٚ ماڵی دونیا کۆبکەیتەوە و وەزیفە و پایەت لەلایەن براو برادەرانت گەورە بیٚ، بۆئەوە کەشخەیان لەسەر لیٚ دەیت و شانازی بەخۆت بکەی...مانای وایە هەموو ڕەنجەکەت بەلاشەو سەرکەوتنت بۆ نیە...بەڵام ئەگەر مەبەستت ژیاندنەوەی شەریعەت و دەستوری پیٚغەمبەر (د.خ) بوو بیٚت و ویستبیٚتت خوڕەوشتی خۆت بەرز بکەیت و بەسەر خۆت زاڵ بی، یاخوا خوا دەست بەباڵی عومرت بگریٚ و هەر بەرز بیەوەو چاکت بۆ بیٚ....شاعیریش ڕاست دەبیٚژیٚ:

گەر شەو نخوونی لەڕیٚ ی تـــۆ نەبیٚ
گشتی بەلاشەو بەفیرۆ دەچـــــــــیٚ
گریانیش لەبەر ترسی تۆ نەبـــــیٚ
ئەی بۆ کیٚ ڕۆندک لەچاو هەڵدەچیٚ؟

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** هەرچەندە بژی ڕۆژێک دێ دەمری، هەر کێت خۆش بوێ ڕۆژێک دێ بەجێ ی دێڵی، هەر چیت دەوێ بیکە، بەڵام ڕۆژێک دێ هەقی خۆت لە مست دەنرێ.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** پێم ناڵێی جگە لە دەهری کردن و عێدز کردنی خوا چ سوودێکت لە عیلمی کەلام و خیلاف و مەنتیق و پزیشکی و دیوان و شیعر و ئەستێرەناسی و عەرووز و ڕێزمان و تەسریف دیتوە؟

لە ئینجیلی عیسادا دیومە دەفەرموێ: (**لەو کاتەی مردوو دەخرێتە نێو تابووتەوە هەتا دادەنرێتە ڕۆخی گۆڕەکەیەوە، خوا بەو گەورەییەی خۆیەوە چل پرسیاری لێ دەکا، لەیەکەمیاندا دەفەرموێ: ساڵەهای ساڵ هەموو ڕنج و گەنجت بۆ ئادەمیزاد بوو، کوچی هیچت بۆ من نەکردو لە پێناوی منیشدا نەختێك دەروونی خۆت خاوێن نەکردەوە... لەکاتێکدا من لە هەموو ڕۆژێکدا تەماشای دەروونی تۆم دەکرد... پێم ناڵێ ی بۆ هەموو شتێکت لە پێناوی خەڵك بوو؟ ئەم نازوو نیعمەتەی بە تۆم بەخشی بوو قەت نەدەهاتە بەر چاوت؟ قابیلە کەڕی تا گوێت لێ نەبێ؟**).

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** زانستی بێ کردەوە شێتیە، کردەوەش بێ زانستی ناشێ...چاکیش بزانە ئەم زانستیەی ئەمڕۆ لە خراپە دوورت ناخاتەوە و ترسی خوات لە دڵدا نانیشێنێ، لێت عەیان بێ بەیانی لە ئاگری دۆزەخیشت ناپارێزێ.
ئەمڕۆکەش ئەگەر کار بە زانین و زانستی خۆت نەکەی و حسێبێک بۆ ڕۆژانی رابردووت نەکەی، بەیانی لە ڕۆژی قیامەتدا دەکەویە تەنگاوی و دەڵێ ی : ( **فارجعنا نعمل صالحا غير الذي كنا نعمل** ) واتا: خوایە بمان گەڕێنەوە دونیایێ، هەتا بە پێچەوانەی ئەو کردەوە خراپانەی کردوومانە، کردەوەی چاک بکەین.
ئەو کاتە وەڵامت دەدرێتەوە: ( **هەی گەوجە ئەدی ئەوە لەوێ نایێتەوە** ).
**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** هەمیشە بە تەنگەوەی گیانی خۆت بە کە گوێت لە ئایەتی ( **ارجعي الى ربك** ) دەبێ، پەروەردەی بکەو بەرزی بکەرەوەو بەسەر نەفس و دەروونی خۆت زاڵ بەو بیخە بەر سێبەری خوا. بشزانە ئەم لەشەی هەتە هەر دەمرێ و گۆڕیش هەموو دەم دەستت ماچ دەکا...مردووەکانیش

هەموو ساتێ چاوەڕێتن تا بچیتە لایان...جا دەخیلتم نەکەی بە دەست بەتاڵییەوە ئۆغر بۆ ئەوێندەر بکەی...حەزرەتی ئەبوبەکر (ر.خ) فەرموویەتی: (**لەشی ئادەمیزاد یا بە وێنەی قەفەسێکەو باڵندەی تیا دەژی ، یا بە وێنەی تەویلەیەکەو ئاژەڵی تیا دەژی**).

جا تۆ بیر لەخۆت بکەرەوە بزانە لە کێهانی؟ ئەگەر لە باڵندەکەی و هەر باڵ پەیدا دەکەیت و وەکو باڵندە بەرەو بەرزایی بەهەشتەوە دەفڕی و بە وێندەرەوە شاد دەبی و عەرشی خوات بۆ دێتە هەژان، وەکو چۆن عەرشی خوا بە مردنی سەعدی کوڕی مەعاز هاتە هەژان. پێغەمبەر (د.خ) دەربارەی مردنی سەعد فەرموویەتی: (**اهتز عرش الله من موت سعد**)....ئەوە ئافەرین بۆ تۆ....ئەگەر خواش نەکا، لە ئاژەڵ بچی و هەموو تەنگەتاوێکت بۆ لەش و ئەندامەکانت بێ و خوات لە بیر چووبێتەوە، وەکو خوا گەورە دەفەرموێ: (**اولئك كالأنعام بل هم أظل**) واتا ئەو جۆرانە لە ئاژەڵ دەکەن، بەڵکو خراپتریشن...ئەوە هەر خوا بتپارێزێ...

جا بۆیە لە خۆت ئەمین مەبەو پێش ئەوەی تووشت بە تووشی ئاگری دونیای ئەوبەر بی، لە پێناوی خوادا ڕەنج بدەو تێبکۆشە.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** دەگێڕنەوە، جارێکیان پەرداخێک ئاویان بۆ شێخ حەسەنی بەسری هێنا، هێشتا ئاوەکەی نەنۆشی بوو، لە هۆش خۆی چوو و پەرداخە ئاوەکەی لە دەست بەربووەوە، هەر کەهۆشی هاتەوە بەرە خۆ پێیان گوت: ئەی باوکی سەعید ئەمە چی بوو بۆ وات بەسەر هات؟ ئەویش گوتی: دۆزەخییەکانم هاتەوە یاد کاتێ پەنا دەبەنە بەر بەهەشتیەکان پێیان دەڵێن یا برەک ئاومان بدەنێ یاخود کەمێک لەوەی خوا پێ ی داون: **(أن أفیضوا علینا من الماء او مما رزقکم الله)** .

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** ئەگەر بە تەنیا زانین و زانیاری بێ کردەوە، کەڵکێکی هەبوایە...حەوجەی ئەوە نەبوو خوا داوا لە مرۆڤ بکا لێ ی بپاڕێتەوە و پەشیمانی خۆیان بنوێنن و تۆبە بکەن، وەک دەفەرموێ: ( **هل من سائل؟ هل من مستغفر ؟ هل من تائب؟** ).

دەگێڕنەوە دەڵێن جارەکیان دەستەیەک لە هاوڕێکانی پێغەمبەر (د.خ) لە خزمەتیدا دانیشتبوون، قسەو باس

کراوه پاشی هاوڕێکان ناوی عەبدولآی کوڕی عومەریان هێنا، پێغەمبەریش (د.خ) فەرمووی: چاکترین پیاو ئەوە (واتا عەبدولآی کوڕی عومەره) ئەگەر شەو نوێژ بکا: (**نعم الرجل هو لو كان يصلى بالليل**)...پێغەمبەر (د.خ) بەیەکێک لە هاوڕێکانی خۆی گوت کە بە شەو زۆر نەخەوێ، چونکی زۆر نووستن وا لە پیاو دەکا لە ڕۆژی قیامەتدا هەژارو مسکێن بێ: (**يا فلان لاتكثر النوم بالليل يدع صاحبه فقيرا يوم القيامة**).

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار**: ئایەتی (**ومن الليل فتجهد به نافلة لك***) فەرمانە و ، ئایەتی (**وبالأسحار هم يستغفرون****) سوپاسکردنی خوایە و، ئایەتی (**والمستغفرين بالأسحار*****) یادکردنی خوایە.

---

*واتا بە شەو خەو بە جێ بێڵەو هەستە بۆ خۆت جگە لەم پێنج نوێژانەی فەرزن نوێژی دیکە بکە کە تایبەتیە بۆ تۆ.

**واتا خوا ناسەکان بەرلەوەی بەیانی دابێ لەخەو ڕادەپەڕن و دەپاڕێنەوەو پەشیمانی خۆیان دەردەبڕن.

***واتا ئەو خواناسانەی بەر لەوەی بەیانی دابێ دەپاڕێنەوەو پەشیمانی خۆیان دەردەبڕن.

پێغەمبەری مەزن (د.خ) فەرموویەتی: (**ثلاث أصواتيحبها الله تعالى: صوت الديك، وصوت الذي، يقرأ القرآن، وصوت المستغفرين بالأسحار**) واتا: سێ دەنگ هەیە خوا زۆری پێ خۆشە: دەنگی کەڵەباب و، دەنگی ئەو کەسەی قورئان دەخوێنێ و دەنگی ئەوان کەسانەی بەر لەوەی بەیانی دابێ لە خوا دەپاڕێنەوەو پەشیمانی خۆیان دەردەبڕن.

سوفیانی سەوری (خ.ر) دەفەرموێ: (**خوای گەورە بایەکی دروست کردووە ئەم بایە پێش ئەوەی بەیانی دابێ هەموو یادو پەشیمانیەکی خواناسەکان دەباتە بەردەم خوا**). هەروەها فەرموویەتی: (**لەسەرەتای نیوەی شەودا لە ژێر عەرشدا بانگ دەکاو دەڵێ: با خوا پەرستەکان لە خەو هەستن، ئەوانیش هەڵدەستن و هەر خوا بە خۆی دەزانێ چەند نوێژ دەکەن، پاشان لە کەرتی شەودا (شطر الليل) بانگ دەرێك بانگ دەکاو دەڵێ: ئەوانەی بۆ خوا مل کەچن (القانتون) با لە خەو هەستن، ئەلهەق ئەوانیش هەڵدەستن تا پێش بەیانی نوێژان دەکەن، لەدوای بەیانیشدا بانگ دەرێك بانگ دەکا دەڵێ: با بێ ئاگایەکان لە خەو**

**هەستن، ئەوانیش هەڵدەستن و وەکو مردووەکان لە گۆڕەکانیاندا بەرەڵلاو پەرت و بلاو کراوین وان ).**
**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** دەگێڕنەوە لوقمانی حەکیم بە کوڕەکەی خۆی گوت: (**ئەی کوڕی خۆشەویستم، با کەڵەباب لە تۆ هۆشیار تر نەبێ، ئەو لە بەیانیەکی زوودا بانگ بداو تۆش لە پرخەی خەودابی**).
**شاعیریش ڕاستی گوتوە:**

**حەیفە سەد حەیف سەر لەبـــەیانی**
**من بێ خەبەر بم کەڵەباب بانگ کا***
**گەر موسڵمانم، خودام خۆش دەوێ**
**دەبێ کەڵەباب چاوەڕێ ی من کـــا**
**بەلأم درۆیە، ڕاستیم بـــــــەرداوە**
**خۆم لە گێژاوی گێژی لـــــوول داوە**

---

*لەبەر خاتری قافیە (بانگ دا) بووە بە (بانگ کا).

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** پوختەی زانست و زانستی ئەوەیە بزانی گوێدێری و خواپەرستی چیە؟ بزانە کە کوێدێری کردنی خواو پەرستنی لەوەدایە لە هەموو فەرمانێکدا بە قسەو بە کردەوە پەیڕەوی فەرمانەکانی ئەو بکەی، واتا: هەر قسەیەکی دەیکەی و هەر کردەوەیەکی جێبەجێ ی دەکەی، دەبێ بەپێ ی فەرمانەکانی شەرع بێ... بۆیە ئەگەر ڕۆژی جەژن و سێ ڕۆژ دوای ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان بە ڕۆژوو بی، مانای وایە سەرپێچی لەشەرعی خوا دەکەی و، ئەگەر بە جلێکی تالآن کراویش نوێژ بکەی، ئەگەرچی شێوەی خوا پەرستی لێ بەدی دەکرێ، بەڵام گوناحت بۆ دەنووسرێ.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** دەبێ قسەو کردەوەت بە پێ ی سەرع بێ، چونکە ئەگەر زانین و کردەوەت پێچەوانەی شەرع بێ ئەو کاتە بە لەڕێ لادەر (**منحرف**) لەقەڵەم دەدەرێ ی.

بەکەی بە قسەی عەلەق و بەلەقی سۆفیان هەڵخەڵەتێ ی، چونکو سۆفیاتی ڕاستەقینە ئەمەیە ساو هەمیشە خەبات بکاو بەسەر شەهوەت و ئارەزووەی خۆی زاڵ بێ و بەشیری مەشق و کۆشش

کردن هەوای نەفسی خۆی بکوژێ...نەک بە قسەی عەلەق و بەلەقی بێ ماناو بەشتی تورەهات خۆی خەریک بکا...ئەوەش بزانە زمانی بەرەڵلاو پیس، هەروەها دڵی پڕ لە غەل و غەش و شەهوەت، نیشانەی بەدبەختی و نەهاتیە. ئەگەر نەفسی خۆت بە تێکۆشان نەکوژی مانای وایە دڵت بە تیشکی زانینەوە ڕۆشن نابێتەوە... ئەوەش بزانە وەلآمی ئەو پرسیارانەی لە منت کردبوو بە نووسین و قسە دیماهی نایەت...ستەمیشە بتوانی لە وەلآمەکانی من بگەی، ئەگەر خەبات لەگەڵ نەفس و دەروونی خۆت نەکەی..بۆچی ئاواشە؟ چونکی مەسەلەکە پەیوەندی لەگەڵ زەوقی مرۆڤەوە هەیەو ناتوانرێ تەنیا بە قسە باسیان لێوە بکرێ و لەوەش دەچێ یەکێک باسی شیرناتی شتی شیرین بکا، یاباسی تاڵی و شتی تاڵ بکا، کەچی ئەمەش بەهەستی چەشتن ( **حاسة الذوق** ) نەبێ نازانرێ...دیسان ئەمە بەمەسەلەی کابراکە دەچێ کەپیاوەتی نەبوو، هەستا نامەیەکی بۆ هاوڕێ ی خۆی نووسی و داوای لێ کرد کەباسی تام و زەوقی سەرجێیی (**جماع**)ی بۆ بکا، چۆنەو چۆن دەبێ، کابراش نەیکردە نامەردی و نامەیەکی بۆ ڕەوانە کردو لە

وەلامەکەیدا بۆی نووسی: فلان وام دەزانی تۆ بەس پیاوەتیت نیە، بەڵکو گەوجیشی، چونکە سەرجێی کارێکە پەیوەندی لەگەڵ زەوقەوە هەیە و ئەگەر بەکێک نەیکا لە زەوقەکە ناگا...لەبەر هەندێکە ئەم مەسەلەیە بەقسە و نوسین باسی لێوە ناکرێ.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار**: هەندێ لە پرسیارەکانت لە ڕێزی ئەم پرسیارانەن کە پێشتر بۆم ڕوون کردیەوە، ئەوانیتریش کەشایانی وەڵام دانەوەن، ئەوا لە کتێبی (**أحياء علوم الدين**) و هی تردا هەن...وا ئێستاکە هەندێکیتان بۆی هەڵدەبژێرین و لە خوارەوە تۆماری دەکەین.

ئەوەی خواپەرست بێ دەبێ پەیڕوی چوار شت بکا:
**یەکەم**: باوەڕێکی تەواو کە هیچ (**بدعە**)یەکی تیا نەبێ.
**دووەم**: تۆبە و پەشیمانیەکی یەکجاری و نەگەڕانەوە بۆ گوناح. **سێیەم**: ڕازی کردنی ئەو کەسەی نەیارتە، هیچ کەسێک هەقی بەسەر تۆدا نەمێنێ. **چوارەم**: هەوڵدان بۆ شارەزایی پەیداکردن لە زانستی شەریعەتدا، بۆئەوەی ئەم زانستیەی هۆی ڕزگاریتە لە خراپیدا، وەدەستت بکەوێ.

دەگێڕنەوە دەڵێن شبلی خوا لێی خۆش بێ خزمەتی چوار سەد مامۆستای کرد لە پاشدان گوتی: **(چوار هەزار فەرمایشتم لەبەر کرد، پاشان لەنێو ئەم چوار** هەزارە یەکێکیانم هەڵبژاردو کارم پێ کردو، وازم لە فەرمایشتەکانی **تر** هێنا، چونکە زانیم ڕزگار بوونی من لەوەدایە بە گوێ ی ئەم فەرمایشتە بکەم کە پڕیەتی لە زانین و زانیاریەی مرۆڤ خۆی پێوە ماندوو کردووە...بەڵێ من ئەم فەرمایشتەم هەڵبژارد کە پێغەمبەر (د.خ) بە هاوڕێکانی خۆی فەرموو: **(اعمل لدنياك بقدر مقامك فيها، واعمل لاخرتك بقدر بقاء ك فيها، واعمل لربك بقدر حاجتك اليه، واعمل للنار بقدر صبرك عليها)** واتا: بەقەد مانەوەت لە دونیادا بۆی هەوڵدەو، بەقەد مانەوەت لە ڕۆژی دواییدا بۆی هەوڵدەو، بەقەد پێویستیت پێ ی هەوڵدە بۆ خواو، بەقەد بەرگەگرتنیشت لە ئاگردا هەوڵدە بۆی.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** ئەگەر لەم فەرمایشتە بگەی، مانای وایە پێویستیت بە زانستییەکی ئەوتۆ نیە تا بە ئەنجامێک بگەی، ئێستاکەش چیرۆکێکت بۆ دەگێڕمەوە کە دەڵێ: کابرایەک هەبوو ناوی **(حاتم الاصم)** بوو، لە برادەرە نزیکەکانی شەقیقی بەڵخی

بوو، ڕۆژێکیان شەقیقی بەلخی پێ ی گوت: تۆ ئەوە سێ ساڵە لەگەڵمایت چ سوودێکت لەم ماوەیەدا دیتوە؟ ئەویش گوتی: هەشت سوودم دیتوە، ئەو هەشتەش بۆ ئەوەیە پێیانەوە ڕزگار بم..شەقیقیش گوتی: ئەو هەشت سوودە چیە؟ حاتەمیش گوتی: **سودی یەکەم**: من تەماشای خەڵکیم کرد، دیتم هەر یەکێ چەند خۆشەویستێک و یارێکی هەیە کە خۆشی دەوێن...هەندێ لەم دۆستە خۆشەویستانە هەتا تووشی نەخۆشیەک دێ، لەگەڵینەو هاودەمینە، بەڵام هەرکە نیشانەی مردنی پێوە دەبینن، هەندێکی تریش لەگەڵیدا دەبن هەتا دەیبەنە ڕۆخی گۆڕەوە، ئەوجە لەوێندەر بەجێی دێڵن و کەس لەگەڵیدا ناچێتە ناو گۆڕەوە. منیش بیرم لە چاکترین دۆستی مرۆڤ کردەوە کەلە گۆڕەوە هاودەمیەتی و لەوێوە سوودێکی پێ دەبەخشێ و دەبێ بە هۆگری ئەوەوە، هەڵبەتە ئەم دۆستەش ئەو کردەوە چاکانەن کە خۆشەویستی منن و چرایەکن بۆ من و پێیانەوە شاد و گوشاد دەبمەوەو بە تەنیایی بەجێم نایەڵن. **سوودی دووەم**: دیتم وا خەڵکی بەدوای شەهوەت و ئارەزووی خۆیان کەوتوونەو چیتریان بە خەیاڵدا نایەت...منیش

ئایەتی خوام هاتەوە یاد کە دەفەرموێ: (**وأما من خاف مقام ربه ونهى النفس عن الهوى فان الجنة هى المأوى**) واتا: ئەوەی لە خوا بترسێ و بەسەر شەهوەت و ئارەزووی خۆیدا زاڵ بێ، شوێنی ئەو کەسە بەهەشتە و لە وێندەر شاد دەبێتەوە..بەمەوە بۆم دەرکەوت کە قورئان ڕاست دەفەرموێ و منیش دەبێ بە پێچەوانەی نەفسی خۆم ڕەفتار بکەم...بۆیە منیش جلەوی تێکۆشانم بە دەستەوە گرت و دەسەلاتی خۆم بەسەر نەفسمدا زاڵ کرد، تاوام لێ کرد ملکەچی فەرمانەکانی خوای گەورە بێ.

**سوودی سێیەم**: سەیرم کرد دیتم هەر یەکێ وا حەولە حەولی ئەوەیتی ماڵ بۆ خۆی کۆبکاتەوە، منیش بیرم لە ئایەتی خوا کردەوە کە دەفەرموێ: (**ماعندكم ينفد وما عندالله باق**) واتا: ئەوەی لای ئێوەیە تەواو دەبێ و دەبڕێتەوە، بەڵام ئەوەی لای خوایە تەواو نابێ و نابڕێتەوە...بۆیە منیش ئەوەی لە لامەوە هەبوو لەڕێ ی خوای بەسەر هەژارو بێ دەسەڵاتاندا دابەش کرد، تابەمەوە لەلایەن خوا گەنجینەیەک بۆ خۆم بڕخسێنم، بۆئەوەی لە ڕۆژی قیامەتدا فریام کەوێ. **سوودی چوارەم**: هێندێ کەسی وام بەرچاو

کەوت، کەبەلایەوە شەرەف و پایە بەرزی لەوە دایە یەکێ قەوم و قیلەیەکی زۆری هەبێ و شانازیان پێوە بکا...هێندەکیان وایان دەزانی شەرەف و پایە بەرزی لەوە دایە یەکێ ماڵ و مناڵێکی فرەی هەبێ و شانازیان پێوە بکا..هێندەکیان وایان دەزانی شەرەف و پایە بەرزی لەوەدایە یەکێ ماڵی خەڵکی تاڵان بکاو زوڵم و خوێن ڕێژی بکا...هێندەکی تریان وایان دەزانی شەرەف و پایە بەرزی لەوە دایە یەکێ ماڵی خۆی پەرت و پەرگەندە بکاو خۆشی نەزانێ چۆنی ببەخشێ. منیش بیرم لە ئایەتی خوا کردەوە کە دەفەرموێ: (**ان أكرمكم عند الله أتقاكم**) واتا: بەڕێزترین کەس لای خوا ئەو کەسەیە زۆر لە خوا بترسێ...بۆیە منیش لە خوا ترسانم بۆ خۆم هەڵبژارد و باوەڕم هێنا کە قورئان ڕاست دەفەرموێ و، ئەوی لە بیری ئەوانایتریش دایە ڕاست نیە.

**سوودی پێنجەم** : دیتم خەڵکی وا زەمی یەکدی دەکەن و پاشملە لە یەکتر دەدوێن، منیش زانیم ئەمەیان لەبەر چاو تەنگیەوەیە و خەم لەیەکتر دەخۆن... بۆیە چاویان بڕیوەتە ماڵ و پایە و زانستی یەکتری، منیش بیرم لە ئایەتی خوا کردەوە کە دەفەرموێ: ( **نحن**

**قيمنا بينهم معيشتهم في الحياة الدنيا )** واتا به پێ ی ویستی خۆمان ماڵ و سامانمان له ژیاندا له نێو خه‌ڵكیدا دابه‌ش كرد و كه‌سی تر هه‌قی به‌سه‌ر نیه...بۆیه منیش زانیم به‌شكردنی هه‌موو شتێک له لایه‌ن خواوه‌یه، ئه‌میش له ئه‌زه‌له‌وه بۆی ره‌خساندووینه، له‌به‌ر ئه‌مه به‌رچاوم ته‌نگ نه‌بوو خه‌مم له كه‌سێ نه‌خواردو، به‌م به‌شه‌ی خوا پێ ی دابووم قایل بووم. **سوودی شه‌شه‌م:** دیتم خه‌ڵكی وا له‌به‌ر چه‌ند هۆیه‌ک دوژمنداری له‌گه‌ڵ یه‌كدی ده‌كه‌ن و منیش بیرم له ئایه‌تی خوا كردەوە كه ده‌فه‌رموێ: **( ان الشيطان لكم عدو فاتخذوه عدوا )** واتا: شه‌یتان دوژمنی ئێوه‌یه و، ئێوه‌ش به دوژمنی دابنێن...بۆیه منیش زانیم كه نابێ جگه له شه‌یتان دوژمنداری له‌گه‌ڵ كه‌سدا بكه‌م. **سوودی حه‌فته‌م:** دیتم هه‌ر یه‌كێ به‌و په‌ڕی تواناو كۆششیه‌وه وا هه‌وڵ ده‌دا بۆئه‌وه‌ی هه‌ر چۆنێک بێ نانێک په‌یدا بكاو، له‌ڕاده به‌ده‌ر خۆی ده‌خاته دوای حه‌رام و گومان و چاوی خۆی نزم ده‌كاته‌وه و به‌جارێ نرخی خۆی دێنێته خواره‌وه. منیش بیرم له ئایه‌تی خوا كردەوە كه ده‌فه‌رموێ: **(وما من دابة في الارض الا على الله**

**رزقها )** واتا: هەر گیانلەبەرێک کەلە زەویدا خول بخواتەوە ئەوە رزقی لەسەر خوایە و ماتەڵ نابێ... بۆیە منیش کە زانیم رزق لەسەر خوای گەورەیە، ڕووم لە خوا کرد و تەنیا چاوم بڕیە ئەم.
**سوودی هەشتەم:** دیتم هەریەکێ پشتی بە شتێ بەستووە، یەکێ بە دینار و درهەم، یەکێ بەماڵ و موڵک، یەکێ بە پیشەو پیشەسازی، یەکێ بە ئادەمیزادێکی وەکو خۆی. منیش بیرم لە ئایەتی خوا کردەوە کە دەفەرموێ: **(ومن يتوكل على الله فهو حسبه ان الله بالغ أمره قد جعل الله لكل شيء قدرا )** واتا: ئەوەی پشت بە خوا ببەستێ ، ئەوەندەی بەسە، خواش ئەوەی بیەوێ جێبەجێی دەکاو، حیسابێکی تایبەتیشی بۆ هەموو شتێک کردووە ڕادەیەکی بۆ داناوە. بۆیە منیش پشتم بەخوا بەست و هەر ئەوم بەسە، ئەویش چاکترین پارێزگارە.
شەقیقی گوتی: خوا دەست بەباڵی عومرت بگری، ئەو هەشت سوودەی بۆ منت گوت، خڕ لە کتێبی تەورات و ئینجیل و زەبوورو قورئان دایەو، هەر یەکێکیش جێبەجێیان بکا مانای وایە فەرمانەکانی ئەم چوار کتێبانەی هێناوەتە دی...

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** لەم دوو چیرۆکەی پێشوودا بۆت ڕوون بووەوە کە تۆ بە تەنیا پێویستیت بەزانین و زانستی نیە...هەر ئێستاش بۆتی ڕوون دەکەمەوە کەدەبێ ئەوەی خواناسەو ڕێ ی هەقی گرتووە چ ئەرکێک بەجێبێنی؟ پێش شتێک دەبێ شێخێک و ڕابەرێکی هەبێ، تا بکاو ڕەوشتی خراپی لێ ڕیشە کێش بکاو ڕەوشتی بەرزی لە شوێن دابنێ...واتای پەروەردەش، لە کردەوەی جووتیارێ دەچێ کە ئەو درک و داڵە زیان بەخشانە لە ناو کشتوکاڵدا دەرکێشێ بۆئەوەی کشتوکاڵەکەی بەرهەم بێنێ و هەراش بێ...هەر بەم جۆرەش پیاوی خواناسیش پێویستی بە شێخێک هەیە پەروەردەی بکاو بۆ خوای ڕێنمایی بکا...چونکو خوای مەزن پێغەمبەری (د.خ) بۆئەوە بۆ خەڵکی ناردووە تا ڕابەریان بکاو، کە دونیاشی بەجێ هێشت خەلیفەی هەیەو جێی ئەو دەگرێتەوە، تا خەڵکی بۆ خوا ئاراستە بکا. مەرجیشە ئەو شێخەی خەلیفەی پێغەمبەرە (د.خ)، زانا بێ...ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە مەرجە هەموو زانایەک بۆ خەلیفایەتی بشێ.

منیش وا لە ئەلعانەوە هەندێ لە نیشانەکانی شێخایەتیت بۆ دەبێژم تا هەریەکێ زانا بوو بڕیاری لەسەر نەدرێ ڕابەرەو شێخە، شێخ ئەو کەسەیە: ماڵی دونیای لەبەر چاودا بەبێ بایەخ نەداتە پایە و پلەی دونیاو، تەریقەتەکەی ئەو بەزنجیرە بکاتەوە پێغەمبەری مەزن (د.خ) نەفسی خۆی خاوێن بکاتەو و فێرە بەرگری بکا، وەکو کەم خواردن و کەم قسە کردن و کەم نووستن و زۆر نوێژ کردن و سەدەقە دان و ڕۆژوو گرتن.

پێویستە پیاو شوێن پێ ی ئەم شێخە بکەوێ کە چەند خاسیەتێکی بەرزی لێوە بەدی دەکرێ و بیکا بە ڕەوشتی خۆی، وەکو بە ئارامی و نوێژ کردن و سوپاس کردنی خواو پشت بە خوا بەستن و یەقینداری و سەخاوەت و قایل بوون بە هەموو ئەشتەکی خواو دڵنیایی نەفسی و لەسەرە خۆیی و زانستی و ڕاستگۆیێ و حەیاو ئەمەگداری و سەنگینی و هێمنی و...هتد.

جا ئەگەر ئەم شێخە ئەم خاسیەتانەی هەبێ، مانای ئەوەیە تیشکێکە لە ڕۆناکی پێغەمبەر (د.خ) و دەشێ پەیڕەوی بکرێ، بەڵام پیاوی ئازا زۆر کەمن و

کەمترن لە گۆگردی سوور*...جا ئەوەی بەختی هەبوو شێخێکی وای دۆزیەوە...ئەوە گەرەکە بە ڕواڵەت و بە دڵ ڕێزی لێ بنێ. ڕێزگرتنی بە ڕواڵەتیش ئەوەیە دەمەتەقێ ی لەگەڵدا نەکاو لە هیچ مەسەلەیەکدا بەرپەرچی نەداتەوە، هەتا ئەگەر شێخەکەش بەهەڵەدا چوو بوو**. ناشبێ جگە لەکاتی نوێژدا دوگردی خۆی لەبەردەم شێخدا ڕایەخێ، چونکە ناماقووڵیە. ئەگەریش لە نوێژیش بووەوە دەبێ زوو دوگردەکە هەڵگرێ و ناشبێ زۆر نوێژی (نەوافل) لەبەردەم شێخدا بکا...دەبێ شێخ چی فەرموو زوو و بەپێ ی توانا جێبەجێی بکا.

ڕێزگرتنی شێخ لەدڵەوە بەمەوە دەبێ هەر چی لە شێخی بەرگوێ کەوت و بەڕواڵەت وەرگرێ، دەبێ لە دڵەوەش باوەڕی پێ

---

*هەڵبەتە ئەو عانی گۆگردی سوور بە نرخ و کەم بووە، بۆیە بە نموونەی هێناوە.

**ئاخر ئیسلام چۆن ئەمە قبووڵ دەکا؟ دوایی لە ئیسلامدا چاو پۆشین لە هەڵە مانای بڕیاردانە بەڕاستی ئەم هەڵەیە. ئەمەش پێچەوانەی دستووری ئیسلامە.

بکا.. نەقسەو نە بەکردەوە پێچەوانەی ئەو نەبێ و ئینکاری نەکا، ئەگینا تووشی ناپاکی (**نفاق**) دەبێ...ئەگەر نەشیتوانی با ماوەیەک لە شێخ دوور کەوێتەوە...بەڵکو خوا دەکا دڵی وەکو ڕواڵەتەکەی لێ دێ. نەکا لەگەڵ هاوڕێ ی خراپدا دانیشێ نەوەکا شەیتانی ئینس و جنۆکە زەفەری پێ ببەن و دڵی لێ تێک بدەن، بۆئەوەی دڵی لە غەڵبە غەڵبی شەیتان خاوێن بێتەوە، دەشبێ هەژاری بۆ خۆی هەڵبژێرێ نەوەک دەوڵەمەندی...ئەنجا ئەوەش بزانە کە سۆفیاتی دوو خاسیەتی هەیە. یەکەمیان مرۆڤ هەمیشە لەگەڵ خوا ڕاست بێ و بە ڕەوشتێکی بەرزەوە لەگەڵ خەڵکیدا جووڵایەوە، ئەوسا بەو کەسە دەگوترێ سۆفی. ئەگەر سۆفیش دەیەوێ لەگەڵ خوادا ڕاست بێ با بەفسی خۆی بە قوربانی فەرمانەکانی خوا بکا. ڕەوشت چاکیت لەگەڵ خەڵکیدا لەوە دایە هەوڵی ئەوە نەدەی هەمیشە بۆ ئارەزوو و مەبەستی خۆت ملکەچیان بکەی تەنیا ئەگەر کارێک بە پێچەوانەی شەرع کرا.

لەدوایدا لە بابەت بەندایەتیەوە لە منت پرسی، ئەویش سێیانە.

**یەکەم**: پاراستنی فەرمانی شەرع. **دووەم**: قایل بوون بە قەزاو قەدەری خواو بەوەی خوا قیسمەتی کردووە. **سێیەم**: ملکەچی بۆ ئەم فەرمانانەی خوا دەریانی کردووە پێیان ڕازی بە.

لەبارەی پشت بە خوا بەستنیشەوە (**التوکل**) لە منت پرسی، پشت بە خوا بەستن مانای ئەوەیە تۆ باوەڕت بەوە هەبێ ئەو بەڵێنەی خوا داویەتی بەجێی دەبێنێ (**واتا باوەڕت بەوە هەبێ خوا چی بۆت نووسیوە ئەوەت بۆ دەبێ و ئەگەر دونیاش هەستێ کەس ناتوانێ لێتی دوور بکاتەوەو، ئەوەی خواش نەینووسی بێ، دونیاش هەستێ بۆت نابێ**). لەبارەی دڵسۆزیەوەش لە منت پرسی، دڵسۆزی ئەوەیە: هەموو کردەوەو ڕەفتارێکت لە پێناوی خوا بێ، دڵیشیت بەمەوەی خۆش نەبێ یەکێک ستایشت بکا، کاتێ زەمیشت دەکرێ غەم مەخۆ. ئەوەش بزانە (**ڕیا**) کاری لەمەوە پەیدا دەبێ بە چاوێکی زۆر بەرز سەیری خەڵک بکرێ. چارە کردنی (**ڕیا**)یش لەوەدایە بەم چاوە تەماشای خەڵکی بکەی کە گشتیان ملکەچی تواناو هێزی خوانەو عەینەن لەرەقەمەن (**جمادات**) دەکەن، کە ناتوانن نەخۆشی و نەناخۆشی بەکەسێ

ببەخشن. ئەم لێکدانەوەش بۆئەوەیە لەم (ڕیا) کاریەدا ڕزگاریتان ببێ و هەر کاتێ تۆش بیری ئەومت کردەوە کە ئەوانە خاوەن هێزو توانانە، مانای وایە خۆت لە (ڕیا) کاریدا دەرباز نەکردووە.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار**: ئەم پرسیارانەی کەماونەتەوە و وەڵامەنەدراینەوە، وەڵامەکانیان لە کتێبەکانی ترم بدۆزەرەوە، نووسینی هێندێکیشیان حەرامە، تۆش ئەوەی دەیزانی کاری پێ بکە، تاکو ئەوەی کە نایزانی بۆت ڕۆن بێتەوە.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار**: لەمەودوا هەر ئیشکالێکت هەبوو بەزار پێم مەڵێ، لەدڵەوە وە منی ڕابگەیەنەو پەلە مەکە، هەروەکو خوا دەفەرموێ: (**ولو انهم صبروا حتى تخرج اليه لكان خيرا لهم**) واتا ئەگەر بهاتایە ئەوان دانیان بەخۆ بگرتایە تا پێغەمبەر (د.خ) لەماڵەوە دەهاتە دەرەوە (چونکە کاتی حەسانەوەی پێغەمبەر بووا)، ئەمە بۆ ئەوان زۆر باشتر بوو. گوێ بگرە ئامۆژگاریی حەزرەتی خدر کاتێ بە حەزرەتی موسا (س.خ) ڕادەگەیەنێ: (**ولا تسألني عن شيء حتى أحدث لك منه ذكرا**) واتا ئەگەر شتێکت بەلاوە سەیر بوو زوو مەیڵێ، هەتا ئەو کاتەی من خۆم

هۆیەکەشت پێ دەڵێم. پەلە مەکە هەتا دەیگەیتێ یا خۆت ئاشکرا دەبێ و بەدیار دەکەوێ (**سأريكم آياتي فلا تستعجلون**) واتا: نیشانەکانی خۆمتان پەیتا پەیتا پیشان دەدەم، پەلە مەکەن... بۆیە پێش ئەوەی کاتی پرسیار کردن بێ، شتم لێ مەپرسە... لێشت یەقین بێ هەتا بەپێ ی فەرمانی خوا بۆی نەچی بەمەبەست ناگەی. (**اولم يسيروا في الارض فينظروا كيف كان عاقبة الذين من قبلهم**) واتا: ئایا ئەمانە لەم زەویەدا نەگەڕلاون تا سەیری ئەنجامی ئەوانەی پێشوو بکەن کە بڕوایان نەهێناوەو هەر هەڵپە هەڵپیان بوو.

ئەی ڕۆڵەی **هۆشیار**: بەخوا ئەگەر بەملاو ئەولادا بڕۆیت، شتی زۆر عەجایب دەبینی... جا تۆش گیانی خۆت ببەخشە (**سەرەتای ئەم ڕێبازەش گیان بەخشینە**) هەروەکو زەنوونی میسریش خوای لێ خۆش بێ بەیەک لە شاگردەکانی خۆی گوت : (**ئەگەر دەتوانی گیانی خۆت بەخت کەیت، فەرمووی لەگەڵدا بکەوە ڕێ، ئەگەر نا خۆت بە تورەهاتی سۆفیاتیەوە خەریك مەکە**).

ئەی ڕۆڵەی **هۆشیار**: من بی هەشت شتان ئامۆژگاریت دەکەم، ئەمەش بۆ ئەوەیە لە ڕۆژی قیامەتدا

زانستیت لێ نەبێتەوە قەزاو بەلاّ. تۆش چواری لێ بەجێ بگەیەنەو وازیش لەچوارەکەی تر بێنەو خۆتی لێ دوور بخەرەوە. ئێستا ئەوەی دەمەوێ وازیان لێ بێنی ئەمانەن: یەکەم: هەرچەندە دەتوانی لەگەڵ کەسدا دەمەتەقە مەکە، چونکو بە فەتارەت دەچی و تووشی نەهامەتی دێ ی . جگە لەوەی دووچاری گوناحان دەبی...چونکە دەمەتەقێ سەرچاوەی هەموو ڕەوشتێکی ناپەسەندە وەکو (ڕیا) کاری و چاوچنۆکی و خۆ بەگەورە زانین و کین و بوغزو ناکۆکی و کەیف بەخۆ هاتن. بەلاّم ئەگەر مەسەلەیەک لە نێوان تۆ و یوکێکی تردا یا دەستەیەکی تردا ڕووی داو تۆش ویستت هەق بەسەر کەوێ و گوم نەبێ، ئەوسا دەتوانرێ باسی لێوە بکرێ، بەلاّم ئەم ویستنەی تۆ دوو نیشانەی هەیە: **یەکەمیان**: هەقت بەوە نەبێ، ئایا ئەم هەقە لەلایەن تۆوە یا لەلایەن یەکێکی ترەوە وەدەردەکەوێ. **دووەمیان**: دەبێ حەز بکەی ئەم باسە لە شوێنێکی چۆڵدا باسی لێوە بکرێ، نەک لە شوێنێکی قەرەباڵغدا. گوێم بدێ بامنیش لێرەدا شتێکی بە سوودت بۆ ڕۆن کەمەوە: ئەوە بزانە، پرسیار کردن لەبارەی گیروگیرفانت، دەبێ وەکو

ئەوە بێ نەخۆشیەکی دڵ نیشانی دختۆرێک بدرێ بۆ چارەسەر کردن. ئەمەش بزانە نەزانەکان ئەوانەن کەنەخۆشی دڵیان* هەیە و زانایەکانیش دختۆرن و زانای ناتەوایش (**دختۆری ناتەواو**) ناتوانێ چارەسەری هەر نەخۆشیەک بکا. هەروەها زانایەکی تەواویش ناتوانێ هەموو نەخۆشیەک چارەسەر بکا، بەڵکو ئەمانە چارەسەر دەکا کە بۆ چاک بوونەوە دەست بدەن. ئەگەر دەردەکەش گران بوو، ئەوە چارەکردنی بێ سوودە و زۆریش ماقوولە ئەگەر دختۆرەکە مەسەلەکەی تێ بگەیەنێ و پێ ی بڵێ: کاکی خۆم هیچ خۆت ماندوو مەکە. چونکە هەرچی بکا بەلاشەو لێ ی بگەڕێ باشترە.

پاشان ئەوە بزانە کە دەردی نەزانین چوار جۆری هەیە:

---

*مەبەست ئەوە نیە دڵ وەکو ئەندامێک نەخۆش بکەوێ، بەڵکو دڵی (مەعنەوی)ی مەبەستە.

**جۆری یەکەم:** چاری دەکرێ، بەڵام ئەوانیتر چاریان ناکرێ و ئەوانەی چاریشیان ناکرێ، یەکێکیان ئەو کەسەیە پرسیار کردن و بەرپەرچ دانەوەی لە حەسوودی و کین و بوغزەو بێ، چونکە هەرچەندە وەڵامێکی چاکیشی بدەیتەوە، ئەو کین و بوغزو حەسادەتی هەر زیاد دەکا و پتریش ڕقی هەڵدەسێ...ئەوجا وا چاکە تۆش خۆت بە وەڵامدانەوەی ئەوکەسە خەریک نەکەی...

هەر ناکۆکیەک گەر ڕوو بـــــــداتن
مرۆڤ دەتوانێ لەناوی بـــــــــبات
تەنیا حەسوودی ماڵی وێران بـــــــێ
ئاگری ناخۆشی هەردەم خۆش دەکات

بۆیە پێویستە تۆش لە پیاوی حەسوود و کین و بوغز دوور کەویتەوە و لێ ی گەڕێ ی لەگەڵ نەخۆشیەکەی خۆیدا گوزەران بکا... خوای مەزنیش دەفەرموێ: (**فاعرض عمن تولى عن ذكرنا ولم يرد الا الحياة الدنيا**) واتا واز لەو کەسە بێنە کە ئێمەی لە بیر چوویتەوەو جگە لەم دونیایەدا چیتری ناوێ...پیاوی حەسوودیش هەرچی بکا، ئاگر لەبەری کردەوەکەی خۆی بەردەدا. وەکو چۆن پێغەمبەر (د.خ) دەفەرموێ:

(الحسد يأكل الحسنات كما تأكل النار الحطب) واتا حەسوودی کردەوەی چاک قڵوف دەکا، وەکو چۆن ئاگر دار دەسووتێنێ.

**جۆری دووەم:** کە نەخۆشیەکەی لە گەوجاتیەوە بێ، ئەمەشیان چارەسەر ناکرێ. وەکو چۆن حەزرەتی عیسا (س.خ) دەفەرموێ: **(من توانیم مردوو بژێینمەوە، بەڵام نەمتوانی چارەی پیاوی گەوج بکەم).**

پیاوی گەوجیش ئەو کەسەیەبۆ ماوەیەک خۆی بەزانستیەوە خەریک بکاو نەختێکیش فێری زانستی شەرعی و ژیری بێ، ئەوجە بێتن خۆی لەقەرەی کەڵە زانایەک بداو بەرپەرچی بداتەوە و نەشزانی ئاخر ئەم زانایە هەموو تەمەنی خۆی بۆ زانستی شەرعی و ژیری تەرخان کردەوە و سەری لەم حاڵەدا سپی کردووە. جائەم گەوجە بەسەزمانەش وا دەزانی ئەم ئیشکالەی خۆی هەیەتی ئەم زانایەش هەیەتی...لەم بارەدا مادەم کابرای ئەحمەق ئەوەندە بێ هەست و خوست و ناتێگەیشتوو بوو، مانای وایە پرسیارکردنەکەی لە گەوجاتیتی...بۆیە پێویست بەوە ناکا خۆتی پێوە خەریک بکەی.

**جۆری سێیەم:** دەبێ ڕاو و ئامۆژگاری پیاوی گەورە وەربگیرێ. ئەگەر لە قسەی پیاوە گەورەو زاناکاندا حاڵی نەبوو، مانای وایە خۆی بێ فکرو بیرە نەک پیاوە گەورەو زاناکە. ئەگەریش پرس کردنەکەشی بۆ سوود وەرگرتن بوو بەلام لە وەلامەکە نەدەگەیشت، مانای وایە خۆی تێگەیشتوو نیە و دەبەنگەو لە ڕاستەقینە ناگا...بۆیە پێویستە پیاو ە وەلام دانەوەی ئەو نەوعە کەسانە خۆی خەریک نەکا...وەک پێغەمبەر (د.خ) فەرموویەتی: ( **نحن معاشر الأنبياء امرنا ان نكلم الناس على قدر عقولهم** ) واتا: ئێمەی کۆمەڵی پێغەمبەران فەرمانمان پێ دراوە بەقەدەر ئەقڵی خەڵک قسەیان لەگەڵدا بکەین.

**جۆری چوارەم:** ئەو نەخۆشیەی پێشتر باسی لێوە کرا چاری دەکرێ، بەمەرجێک ئەو کەسە هەمیشە ڕای گەورەی خۆی وەرگری و ژیرو تێگەیشتوو بێ...ناشبێ حەسەد و تووڕەیی و خۆشویستنی شەهوەت و پایەو ماڵ بەسەریدا زاڵ بێ...دەبێ داوای ڕێ ی ڕاست بکا. ئەگەر کابرای پرسیارت لێ دەکا و بەرپەرچت دەداتەوە لە حەسادەتەوە نەبێ و بۆ ئەوەی نەبێ لە قسەکردندا لێت بشێوێنێ و

تاقیت بکاتەوە، ئەو کاتە مانعات نیە ئەگەر خۆت لەگەڵ ئەم کابرایەداخەریک بکەیت و وەڵامی بدەیتەوە، بەڵکو پێویستە وەڵامی بدەیتەوە.

**دووەم:** ئەوەیە دەبێ لەکاتی دەبیە (**ئامۆژگار ـ واعیز**) و وەبیرهێنەرەوە (**المذکر**)، زۆر ئاگات لە خۆبێ، چونکو زۆر کارەساتی لێوە پەیدا دەبێ...کارەساتەکەش لەوەدایە کاتی قسەیەک یان نسحەتێک دەکەی و خۆت کار بەم قسەو نسحەتانەی ناکەی، بۆیە خەڵک لێت دەرەونەوە...بیریش لەم قسە بکەرەوە کە بە عیسای کوڕی مەریەم گوتراوە: (**ئەی کوڕی مەریەم پێشتر ئامۆژگاری خۆت بکە ئەگەر زانیت بە پێ ی ئامۆژگاریەکانی خۆت کار دەکەیت، ئەنجا ئامۆژگاری خەڵکی بکە، ئەگەرنا شەرم لە پەروەردگاری خۆت بکە**).

ئەگەر تووشی ئامۆژگاری کردن بووی ئاگات لە دوو خەسیەتەکان هەبێ: یەکەمیان: لە قسەکردن عیبارەت و شیعر خوێندنەوەدا، زۆر مەینەو مەبە، چونکە زۆر ڕقی لەو کەسەیە لە کاری خۆیدا لە ئەندازە بەدەر بێ...جگە لەوەی ئەم خۆ هێنان و بردنەش نیشانەی ئەوەیە ئەم ئامۆژگارە دڵی زیندوو

نیە و بێ ئاگاشە. واتای وە بیر هێنانەوەشە (التذكير) ئەمەیە: بەندە ئاگری دونیای ئەوبەری بێتەوە یاد کەلە ئەنجامی بێ باوەڕیەوە تووشی دێ و حاڵ و باری خۆی وەبیربێتەوە کاتێ فریشتەی مردن (ملك الموت) دێنە زگی و ئایا توانای ئەوەی هەیە وەڵامی (نكير و منكر) بداتەوە؟ ئایا زەبر و زەنگی ڕۆژی قیامەت دەیبزوێنێ؟ ئایا لە پردی سیراتێ (الصراط المستقيم) دەربازی دەبێ یا دەونخونی ئاگر دەبێ. بەم جۆرە کابرای ئامۆژگار لەم قسانەدا بەردەوام دەبێ، تا بەمانەوە دڵی خەڵکی بێنێتە هەژان و نەیەڵێ لە قەرارێکدا بمێنێ. بەم جۆرە باسانەی کە زەبر و زەنگی ئەم ئاگرە و زەبرو زەنگی کارەسات وەبیر دێننەوە، دەگوترێ وەبیرهاتنەوە. سرنج ڕاکێشانی خەڵکی بۆ ئەم شتانە و زانینیان بۆ ئەم عەیب و کەمو کورتیانەی هەیەتیان بۆ ئەوەیە ئەوانەی لەم کۆڕەدا دانیشتوونە هەست بە گەرمایی ئاگری دۆزەخ بکەن و لەو کارەساتانەی تووشیان دێ بکەونە ترسان، هەروەها بۆ ئەوەیە بە پێ ی توانا دەرک بەتەمەنی ڕابردوویان بکەن و ئاخ بۆ ڕۆژانی

پێشووی کەلە بەگوێ کردنی خوا نەیان بردۆتە سەر هەڵکێشن.

چا قسە کردن ئەگەر لە چوار چێوەی قسەکانی پێشوو بێ و بێ خۆهەڵکێشان بێ، ئەوە پێ ی دەبێژرێ ئامۆژگاری. ئەم جۆرە ئامۆژگاریەش لەوە دەچێ تۆ دیتت وا لێشاوی ئاو ڕووی لەماڵێکدا کردووەو خەریکە ڕاپێچی بکاو خاوەن ماڵ و منالْ و منالەکانیش وا لەوێندەرن...تۆش خێرا دەڵێ ی: ووریابن ووریابن، ڕابکەن لەبەر لێشاوی ئاو...هەڵبەتە ماقووڵ نیە تۆ هەستی بە زنجیرەیەک عیبارەتی زل زل و نوکتە و ئیشارەت ئاگاداریان بکەیتەوە، چونکە ئەم جۆرە شێوازە هی پیاوی ژیر نیە. دەبێ باری (ئامۆژگار) یش بەم شێوەیە بێ کەباسمان کرد.

**دووەمیان**: لە ئامۆژگاریەکاندا، هەوڵی ئەوە مەدە وا لە خەڵکی کۆڕەکە بکەی های و هوو بکەن، یا شەوق و هەوەسی خۆیان دەربڕن، یا لەتاوان جلوبەرگی خۆیان بدڕن چیە بگوترێ ئەمە چاکترین کۆڕ و مەجلیسە. چونکی ئەم جۆرە ڕەفتارە گشتی ئارەزووی دونیا زێدە دەکا، ئەمەشیان لەبێ ئاگاییەوە پەیدا دەبێ،

بەڵکو پێویستە وورەو هەوڵت بۆ ئەوە بێ خەڵکی لەم دونیاوەی بۆ دونیای تر بگوێزێتەوە و لە گوناح و گوناحکاری بۆ لە گوێ گرتنی قسەکانی خواو، لە چاوچنۆکیەوە بۆ ئارەزوو لەسەر شتی دونیا لابردن و لە ڕەزیلیەوە بۆ سەخاوەت و لە گومانەوە بۆ یەقین و لەبێ ئاگاییەوە بۆ وووریایی و لەخۆبەزل زانینەوە بۆ لەخوا ترسانیان ببا..هەروەها دونیای ئەولایان لا خۆشەویست بکاو ئەم دونیایەشیان پێ بیوغزێنێ و فێری زانستی پەرستن و دڵ مراندنایان بکاو هەموو دەمێ بە کرەمی خواو بەخشندەیی دڵ خۆشیان نەکا، چونکە ئەوان هەر خۆڕسک خۆیان تێگەیشتنی شەریعەتا گێل دەکەن و کۆشش بۆ ئەو شتە دەکەن کە خوا پێ ی ناخۆشە و ڕەفتاری خراپیش پەسەند دەکەن. تۆش ترسی خوایان بخەرە ناو دڵ و بیان هەژێنەوە و ئەم ئەنجامە تاڵەیان بخەرە بەرچاو کە تووشیان دێ...ئەمەش لە پێناوی ئەمەی بەڵکو خوا دەکا دڵیان بەشێوەیەکی چاکتر دەگۆڕی و ئارەزووی خوایان دەکەوێتە کەڵکەڵەو واز لە گوناحان دێنن. ئائەمەیە ئامۆژگاری و ئاراستەکردن، هەر ئامۆژگاریەکیش بەم جۆرە نەبێ، ئۆباڵی دەکەوێتە

سەر ئەو کەسەی گوتوویەتی و ئەو کەسەی گویٚ ی داوەتیٚ، بەڵکو هەندێک دەڵێن ئامۆژگاری بەوەستایی نەبیٚ مانای وایە ئامۆژگاریەکە پڕیەتی لە دێو و شەیتان کە تەنیا خەڵکی لە ڕێگا لادەدەن و بە فەتارەتیان دەدەن. پێویستیشە خەڵکی لەم جۆرە (**ئامۆژگار**)انە دوورکەونەوە، چونکە ئەم زیانەی ئەم جۆرە (**ئامۆژگار-واعیز**)انە بە ئایینی دەگەیەنن، شەیتانیش ناتوانیٚ ئەم جۆرە زیانە بە ئایین بگەیەنیٚ. ئەگەر یەکێکیش دەسەڵات و توانای هەبوو، دەبیٚ ئەم جۆرە ئامۆژگارانە لە دوانگە (**منبر**)کانی ئامۆژگاریدا بێنێتە خوارەوە ئامۆژگاری کردنی لیٚ قەدەغە بکریٚ، چونکە ئەو کارەی ئەم دەسەڵاتدارە دەیکا لە دەروازەی (**الامر بالمعروف و النهی عن المنکر**)ە.

سێیەم: تێکەڵ بە ئەمیرو سوڵتانەکان نەبیٚ و نەیان بێنی، چونکە دیتنیان و دانیشتن لەگەڵیاندا کارەساتێکی زلەو پیاو گرفتار دەبیٚ...ئەگەر تووشیان هاتی نەکەی ستایشیان بکەی و بەسەریاندا هەڵبلٚی ی ، چونکە خوا لەو کەسە دەهری دەبیٚ کەستایشی

فاسق و بەدکاران بکا...ئەوەی نزایشیان بۆ بکا، مانای وایە حەز دەکا مرۆڤ لە خوا ئاغی بێ.

چوارەم: نەکەی بەخشیش و دیاری ئەمیرەکان قبووڵ بکەی، هەتا ئەگەر بشزانی کەوا حەلاڵە، چونکە چاوچنۆکی کردن بۆ بەخشیش و دیاری ئەوان زیان بە ئایین دەگەنێ. واش لە پیاو دەکا ناچاربێ پشتگیریان بکاو بەستەمکاری ئەوانەوە قایل بێ و ئەمەش گشتی زیان بە ئایین دەگەیەنێ و کەمتریش زیانیش ئەوەیە ئەگەر تۆ بە بەخشینشەکانیان قایل بوویت و سوودت لە دونیای ئەواندا وەرگرت مانای وایە خۆشت ویستن، ئەگەر یەکێکیش یەکێکی تری خۆش ویست حەز دەکا تەمەنی درێژ بێ، لە خۆش ویستنی زۆرداریشدا ئارەزووی زۆرداری پەیدا دەبێ، واتا ئارەزووی تێکدانی جیهان پەیدا دەبێ، جا چ لەمەوە بۆ ئایین و دوارۆژ زیان بەخش تر دەبێ، قەت دەرفەت نەدەی شەیتان هەڵت بخەڵەتێنێ، یا بەقسەی خەڵکی هەڵبخەڵەتێ ی . چاک وایە ئەم دینارو درهەمانەی ئەم ئەمیرو سوڵتانانە دەیدەن لێیان وەرگری و بەناو هەژارو بێ دەسەلاَتاندابلاَوی بکەیتەوە، چونکە ئەوان لەرێ ی بەدکاری و گوناحدا

بلاوی دەکەنەوە و بەخشینی تۆش بەسەر لێقەوماوان چاکترە لە خەرجکردنی ئەمیرو سوڵتانان...شەیتانی نەفرەت لێ کراو ملی زۆر کەسانی بەو ڕاڕایی و وەسواسیە شکاندووە، هەروەکو لە کتێبی (أحياء علوم الدين) دا باسمان کردووە، تۆش وەریگرەو بیخوێنەوە.

ئەم چوارەی دەبێ جێبەجێیان بکەی:

**یەکەمین:** دەبێ مامەڵە کردنت لەگەڵ خوادا بەجۆرێک بێ، کە ئەگەر بەندەی تۆ ئاوا لەگەڵ تۆدا مامەڵە بکات لێ ی ڕازی دەبی و لێ ی دەهری نابی، مادەم ناتەوێ بەندەی مەجازی ی تۆ بە خەراپی لەگەڵتا بکا، تۆش لەخۆت ڕازی مەبە ئاوا لەگەڵ خوا بکەی، کە هەر خوا گەورەی تۆیە.

**دووەمین:** هەر ئیشێکت بۆ خەڵکی کرد، بەجۆرێک بیکە کە تۆ دەتەوێ خەڵکی بەم جۆرە ئیشت بۆ بکەن، چونکە باوەڕی بەندە هەرگیز تەواو و پوختە نابێ ئەگەر چۆن بۆ خۆی دەوێ ئاواش بۆ خەڵکی نەوێ.

**سێیەمین:** ئەگەر خەریکی زانیاری بووی یا موتالاَت کرد، پێویستە زانستیەکە چاری دڵت بکاو نەفست

پاکژ بکاتەوە، وەکو ئەوەی پێت بگوترێ تەمەنت لەیەک حەفتەی تر ڕەت ناکا...هەڵبەتە ئەم حەفتەیە بە زانستی (**فقة**) و ڕەوشت و (**اصول**)و(**کەلام**) و ئەوانیتر خەریک ناکەی، چونکە ئەو کاتە دەزانی ئەم زانستیانە هیچیان بۆ قیامەت بەهانای تۆ ناگەن، بۆیە خەریکی پاکژ کردنەوەی دڵ و دەروونت دەبی و چاوەدێریان دەکەیت و هەوڵ دەدەی لەو شتانە دوورکەوێتەوە کە بە دونیاوە دەتبەستن و تێدەکۆشێ زیاتر خوات خۆش بوێ و بەقەد تۆزقاڵێ بەرەو خراپی نەکەویە ڕێگا. ئەو شەو و ڕۆژەش کەبەسەر بەندە تێدەپەڕی نابێ تیایاندا دڵنیابێ بەوەی کە نامرێ.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** قسەیەکی تر هەیە لە منی ببیستە و بیریشی لێ بکەرەوە، هەتا ڕزگاری لێ بەدی بکەی: ئەگەر هەواڵی ئەوەت بۆهات سوڵتان دوای حەفتەیەک سەردانێکت دەکا، چی دەکەی؟ ئەمن سوڕ دەزانم ئەو کاتە هەر خەریکی ئەوە دەبی ئەو شتانە ڕێک بخەی کە سوڵتان چاوی پێ دەکەوێ، وەکو جلوبەرگ و بەدەن و خانوو و نوین و ئەوانیتر...ئێستاکەش بیر لەوەی گوتم بکەرەوە و،

تۆش باش تێدەگەی، ووتەیەکی ئاواش بۆ کوڕێکی دانای بەووره بەسە، پێغەمبەرمان (د.خ) دەفەرموێ: (**ان االله لا ینظر الی صورکم ولا الی اعمالکم ولکن ینظر الی قلوبکم ونیاتکم**) واتا: خوا تەماشای سەرو سیماو کردەوەی ئێوه ناکا، بەڵکو تەماشای دڵ و نیازتان دەکا...ئەگەر ویستیشت لە زانستی بارەکانی دڵ (**علم احوال القلب**) بگەی سەیری کتێبی (**الاحیاء**) و کتێبەکانی تر بکە...ئەو زانستیه (**فرض عین**)ە و ئەوانیتر (**فرض کفایة**)ن. بێجگە لەمەش دەبێ زانستی جێبەجێکردنی فەرزەکانیش بزانی کە ئەمیش (**فرض عین**)ە.

**چوارەمین:** زەخیره و ماڵ و شتی دونیا بۆ ساڵێک زیاتر هەڵمەگرە، بۆ ئەم مەبەستەش پێغەمبەر (د.خ) ژوورێکی تەرخان دەکردو فەرموویەتی: (**اللهم اجعل قوت ال محمد کفافا**) واتا: خوایە قووتی کەسوکاری محمد هەر هەندە بێ پێ ی بچین، نەزۆر نەکەم...وەنەبێ بۆ هەموو ژوورێکی زەخیرەی ساڵێکی دابنایە، بەڵکو تەنیا بۆ ئەو ژوورانەی دادەنا کە خێزانەکەی حەزی بەوه دەکرد زەخیرەی ساڵێکی هەبێ، ئەگینا دڵ چەسپ و قایم بوو قووتی ڕۆژێک یا نیو ڕۆژی بۆ دادەنا.

**ئەی ڕۆڵەی هۆشیار:** من لەم بەشەدا کەبۆم نووسیبووی پەنا دێنمە بەرت و داوات لێ دەکەم کاری پێ بکەیت و لە نزایە چاکەکانی خۆتدا بێ بەشم نەکەی و ئەو نزایەی لە منت داواکرد بوو لە کتێبەکانی (**صحاح**)دا وەری بگرە. ئەم نزایەی خوارەوەش لە هەموو کاتێکا بە تایبەتی لەدوای نوێژەکانتا بخوێنەوە: اخوایە داوای نازو نیعمەتێکی تەواوەت لێ دەکەم و داوات لێ دەکەم هەمیشە بمپارێزی و بەتەواوەتی ڕەحمم پێ بکەیت و بەهەشتم پێ ببەخشی و لە نیعمەتەکانی خۆتدا گشتم بدەیتی و سازگارترین فەزڵی خۆتم پێ بدەو بە لوتفە بەرزەکەی خۆت لەگەڵمدا بکە، خوایە بە چاکەی خۆت لەگەڵمدا بکە، بە سزای خۆت لەگەڵمدا مەکە. خوایە هیوامان پتر بهێنە دی و، لە بەیانیەوە ژیانمان بەخۆشی بچێتە سەرو ئامانجمان بخە ژێر باری میهرەبانی خۆت و بارانی لێ خۆشبوونی خۆت بەسەرمان ببارێنە و وامان لێ بکە بتوانین چارەی عەیبەکانی خۆمان بکەین و بە خواناسی بمان ژێنە و ئەو زانیاریەمان بدەرێ کە بتوانین (**اجتهاد**)) لە ئاینی تۆدا بکەیین...خوایە پشتمان بە تۆوە قایمەو متمانەش هەر بە تۆ دەکەین...خوایە لە شەقامە ڕێ ی ئیسلامدا بەرەو ئامانجمان ببە...لەو شتانەشمان

دوور بخە کەلە ڕۆژی قیامەتەوە پێیانەوە گرفتار دەبین...ئەرکی سەرشانمان سووک بکە و بە پیاو چاکی بمان ژێنەو لە خراپی خەراپەکاران دوورمان بخە...ئێمەو دایک و باوک و برا وخوشکانمان لە ئاگری دۆزەخ بپارێزە...بە بەخشندەیی خۆت لەگەڵماندا بکە...ئەی ئازیز...ئەی ئەوەی لە گوناحان خۆش دەبێ...ئەی ئەوەی بەکەرەمی خۆی لە گەڵماندا دەکا...ئەی ئەوەی عەیبمان دادەپۆشی...ئەی ئەوەی ئاگای لە هەموو شتێکە...ئەی ئەوەی کە بە دەسەڵاتی...خوایە...خوایە...خوایە...بەڕەحمەتی خۆت لەگەڵماندا بکە...ئەی ئەوەی کە هەر خۆی سەرەتایەو جڵە وکیری دیماهیە..ئەوەی پڕ هێزو توانایە و ڕەحم بە هەزاران دەکا و لە هەموو کەسێک بە ڕەحم ترە...هیچ خوایەک نیە جگە لە تۆ..چەند پاک و بێ خەوشی...خوایە من گوناهبارم...هەزارەها سڵاویش لە گەورەمان محمد (د.خ) و لە هەموو خزم و یارو یاوەرانی بێ...سوپاسیش بۆ خواو پەروەردگاری هەموو دونیا.

**********

*******